بسم الله الرحمن الرحيم

" سعد كوڕى معاذ "

خوشكان و برايانم إن شاء الله ئەم جارە لەخزمەتى داستانى يەكێك لە قارەمانە ڕاستەقينەكانى ئوممەتى محمد ﷺ دا دەبين، قارەمانێك كە ئەمڕۆ باسى دەكەين كە يەكێكە لەو پياوانەى ئوممەتى موحەممەد كە بەخوێنى خۆيان تاريخێكيان نووسى، باسى قارەمانێك دەكەين كە لە (٣٠) ساڵى ئيمانى هێنا و لە (٣٧) ساڵى شەهيد بوو باسى قارەمان و پاڵەوانێك دەكەين كە ئەوكاتەى وەفات دەكات عەرشى خواى تعالى لەخۆشى هاتنى ئەوكەسە دەكەوێتە لەرزين

باسى پاڵەوانێك دەكەين كە گەورەى قەومەكەى خۆى بوو يەكێك لە گەورە پياوەكانى مەدينەبوو كە لەسەر دەستى پاڵەوانى ئوممەتى موحەممەد ﷺ (مصعب كورى عومەير) ئيمانى هێنا لەسەر دەستى داعيەكەى پێغەمبەر ﷺ لەسەر دەستى شەهيدى ئوممەتى رسول الله ﷺ

(مصعب كورى عومەير) ئيمانى هێنا

باسى كەسێك دەكەين كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووى لەبارەى حەريرێكەوە كە پارچەيەكى نەرم و جوان بوو كە پيشانى پێغەمبەريان دا ﷺ فەرمووى: عەمامەكەى (سعدى كورى معاذ) لەبەهەشت باشتر و جوانترە لەوحەريرە

بەڵێ باسى (سعدى كورى معاذ) دەكەين سعدێك كە گەنجێكى سپى پێست، دەم و چاوێكى شيرين و جوان و چاوێكى ڕەش و جوانى هەبوو

(سعدی کوری معاذ) گەنجێکی (٣٠) ساڵە کە هەر لەگەنجیەوە کرابوو بە گەورەی قەومەکە خۆی بە گەورەی تایەفەی (ئەوس) لەمەدینە

کاتێک پێغەمبەر ﷺ (مصعب کوری عومەیر) دەنێرێ بۆ مەدینە بۆ ئەوەی دەعوەی خەڵک بکات بۆ ئیسلام

(سعدی کوری معاذ) کاتێک (مصعب کوری عومەیر) دەچێتە مەدینە لەگەڵ (ئوسەیدی کوری حوضەیر) کە دەبینێت ئەوە (مصعب) هاتووە

بانگی خەڵکی دەکات بۆ ئیسلام ئەوانیش ئەوکاتە کافرن هێشتا نەهاتونەتە سەر دینی ئیسلام

زۆریان پێ ناخۆش دەبێت، خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی بچن پێش لە (مصعب کوری عومەیر) بگرن

لەدوایدا کە (ئوسەید) دەچێ بۆلای و قسەی لەگەڵ دەکات و ئیمان دەهێنێ و دەگەڕێتەوە

ئینجا (سعد کوری معاذ) دەچێ بۆلای و قسەی لەگەڵ دەکات دوای ئەوەی کە چاوی دەکەوێت بە دەم و چاوی جوانی (مصعب کوری عومەیر) هەڵسوکەوتی جوان و نەرم و نیانی بینی کە چەند ئایەتێکی لە کەلامی خوای تعالی بو خوێندەوە یەکسەر ئایەتەکان لەسەر دڵی جوامێری مەدینە گەورەی قەومەکەی خۆی

(سعد کوری معاذ) دەنیشێت ئەوکاتە زۆر بەجوانی و نەرم و نیانی بە (مصعب) دەڵێت:

ئەی (مصعب) ئەگەی یەکێک بیەوێ بێتە ناو ئەو دینەی ئێوەوە دەبێ چی بکات؟ چۆن دەتوانێ بێتە ناو دینەکەی ئێوەوە؟!!

(مصعب) لەوەڵامدا فەرمووی:
دەچێت غوسڵێک دەکات و دەست نوێژێک هەڵدەگرێت و دوای ئەوە دەڵێت(أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمد رسول الله)

کە (سعد کوری معاذ) دەگەڕێتەوە بۆلای قەومەکەی کاتێک قەومەکەی چاویان پێکەوت وتیان:
واللەهی (سعد کوری معاذ) بەو دەم چاوەی کە رۆیشت بەو دەم و چاوە نەگەڕایەوە شكڵ و قیافەی (سعد کوری معاذ) فەرقی کردووە
خەڵکی لەوکاتەدا ئیمانیان نەهێنابوو لەمەدینە مەگەر چەند کەسانێکی زۆر کەم نەبێت کە ئیمانیان هێنابوو

کە (سعد کوری معاذ) دەگەڕێتەوە لای قەومەکەی رووی کردە قەومەکەی بەشێوازێکی زۆر جوان بەقەومەکەی خۆی گوت: رەئی من لەسەر ئێوەدا چۆنە؟
ئەگەر من قسەیەک بکەم ئێوە چۆن لەو قسەیەی من تێدەگەن؟
ئەوانیش وتیان واللەهی تۆ گەورەی ئێمەی و بەرێزی ئێمەی هەرشتێک تۆ بیڵێی ئێمە جوابت دەدەینەوە و لەسەر ئەو قسەیەی تۆ دەڕۆین

(سعدی کوری معاذ) فەرمووی:
واللەهی قسەکردن لەگەڵ ئێوە لەسەر من حەرامە چ پیاوتان چ ژنتان قسەتان لەگەڵ ناکەم
(حتی تؤمن بالله ورسوله) هەتا ئیمان نەهێنن بە (الله و رسولەکەی)

سبحان الله هەر کە ئیمان دێنێ یەکەم کار دەیکات یەکسەر دەبێ بە داعی بۆ دینی ئیسلام
هەر هەموویان دانە دانە ئیمان دێنن بە رسول الله ﷺ
وە دێنە سە دینی جوانی ئیسلام
لەسەر دەعوەی (سعد کوری معاذ) ولەپێش ئەودا دەعوەی شەهیدی ئوممەتی رسول الله ﷺ (مصعب کوری عومەیر)

واللەهی یەک ماڵ نەما لە تایەفەی (بەنی عەبدول أشهل)
ئیلا ئەوەی هەر هەموویان بوون بە موسڵمان
چ ژنیان چ پیاویان چ منداڵیان چ گەنجیان
سبحان الله ئەوەش لە گەورەیی (سعدی کوری معاذە) کە خوای گەورە ئەو عیزەت و حیکمەتەی پێ بەخشی کە هەر لەسەرەتاکانی ئیمانی دا ئەوەی بەنسیب کرد ئەوەش خوای تعالی بەنسیبی هەموو کەسی ناکات

ساڵێک (مصعب کوری عومەیر) لەناویاندا دەمێنێتەوە خەڵکی مەدینە لێی فێری ئیمان دەبن، پاش ماوەیەک دەڵێن باشە ئێمە چۆن قەبوڵی بکەین رسول الله ﷺ لەناو خەڵکی مەککە بێت و عەزێتی بدەن و ئازاری بدەن، ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ و صەحابەکان وە عەمماری کوری یاسر و سومەیەی دایکی و بیلال و چەندانی تر....

لە چ ئێش و ئازارێکدان وتیان ئێمە چۆن تەحەمول بکەین
کە پێغەمبەر ﷺ لەو ئێش و ئازارەدابێت

بۆیە یەکسەر وەفدێکیان نارد بۆ مەککە ئەو کەسانەی ئیمانیان هێنابوو لەگەڵ (سعدی کوری معاذ) لەگەڵ فەرماندەکەی خۆیان (مصعب کوری عومەیر) هاتن بۆلای رسول الله ﷺ وە لە (مەککە ) بەیعەتی دووەمیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەست کاتێک بەیعەتیان لەگەڵ بەست وە وەعدیان دا بە رسول الله ﷺ کە وەرن بۆ مەدینە ئێمە بەگیان و ماڵمان بەهەموو شتێکمان دیفاعت لێ دەکەین ئەی پێغەمبەری خوا یەکێک لەوانەی لەنێو ئەو دەستەیەدا بوو

(سعدی کوری معاذ) بوو

پێغەمبەر ﷺ دوای ماوەیەک کە (مصعب کوری عومەیر) بە بەرەکەتی دەعوەکەی ئەو مەدینە ئامادە دەبێت بۆ ئەوەی پێغەمبەرمان ﷺ هیجرەت بکەن و هیجرەت دەکەن بۆ مەدینە.

کە دەچێتەوە بۆ مەدینە لەوێ یەکێک لەو صحابەی پێغەمبەری خوا و مهاجرەکان بە تەواوەتی و بە گیان و ماڵەوە وەردەگرێ(سعدی کوڕی معاذ)و تایەفەکەیەتی (سعد) لەوێشدا ماڵەکەی خۆی هەر هەمووی دادەنێت لە خزمەت دینی ئیسلامدا.

دوای ماوەیەک کە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە دەمێنیتەوە دوو ساڵ دەبێت کە پێغەمبەر لە مەدینەیە

کاروانەکەی (أبو سفيان )بە لای مەدینەدا تێپەڕ دەبێت کاروانەکەی پێغەمبەرمان ﷺ هێرش دەکەنە سەر (أبو سفيان) خەبەر دێنێتەوە بۆ خەڵکی مەککە ئەوە(محمد) هێرشی کردۆتە سەر کاروانەکەم قورەیشیش لەشکرێک گەورە ئامادە دەکات کە (هەزار وچەند ئەوەندە) نەفەر ئامادە بوون بۆ ئەوەی حەملە بکەن بەسەر موسڵماناندا وە ژمارەی موسڵمانان لە کاتەدا تەنها(٣١٣) نەفەر دەبێت ،کاتێک کە

پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەیە پێش ئەوەی بڕوات بۆ( بدر) پێی خۆشە قسە بکات لەگەڵ أصحابی خۆی ئایا بزانە صحابەکان ڕەئیان چۆنە لە بارەی شەرکردن لەگەڵ کافرەکانی قورەیشەوە چییە؟

ئیمامی (أبو بکر) رضي الله عنه فەرمووی :-دیفاعت لێئەکەین و شەڕ ئەکەین و دیفاع ئەکەین لە دینی الله تا دوا قەترەی خوێنمان

ئیمامی(عمر کوڕی خطاب) رضي الله عنه فەرمووی :- یا رسول الله دەچینە دەرەوە و شەڕیان لەگەڵ دەکەین

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:-
(أشروا علیە أیها الناس ) :- فەرمووی ئەی خەڵکینە مەشورەتی خۆتان لەگەڵ من دەڕبڕن دیسان هەندێکی تری صحابە بە جواب هاتن ئەم جارەیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:-
(أشروا علیە أیها الناس)مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە مشاوەرەکردنی أبو بکر و عمر نەبوو چونکە پێغەمبەر ﷺ وەفاداری ئەوانی بینیبوو لە پێشودا مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە ئەنصارییەکان بوو
سعد یەکسەر حاڵی بوو کە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوانە ،سعد فەرمووی ئەی رسول الله ﷺ پێم وایە مەبەستت لە ئێمەیە پێغەمبەر ﷺ بزەیەک هاتە سەر لێوی
(أجل أجل یا سعد) فەرمووی بەڵێ ئەی سعد
ئا لەو کاتەدا(سعدکوڕی معاذ) هەستایە سەر پێ و بە قارەمانانە بەو پەڕی حەماسەوە فەرمووی:-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ،ئێمە پێشتر ئیمانمان بە تۆهێناوە وە شایەتیشمان داوە بەو بەرنامەیەی کە تۆ پێتەو ئەو دینەی کە تۆ هێناوتە ئەو دینە حەقە وە پێشتریش ئێمە لەسەر ئەوشتە عەهدو پەیمانمان پێ داوی،

ئەی پێغەمبەری خوا بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ ئێمە لەگەڵتین دەستمان لەگەڵ دەستە ئەی پێغەمبەری خوا
سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە حەق ناردووە کە الله-یە (رب العزة) ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بچیتە نێو ئەو بەحرە پچیتە ناو ئەو دەریایە وەڵاهی لەگەڵت دێین
سوێند بە زاتی پاکی الله ئەی رسول الله ﷺ یەک نەفەر لە ئێمە سەرپێچی ناکات ئیلا مەگەر شوێنت دەکەوین یا رسول الله پێشمان ناخۆش نیە وەڵاهی ترسیشمان نیە لەوەی کە سبەینێ بدەیت بەسەر دوژمنانی ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا لەشەڕدا صبر دەگرین وە لە کاتی ڕوبوونەوە لەگەڵ دوژمن صادقین
وە ڕاست دەکەین ئەی پێغەمبەری خوا إن شاء الله، الله تعالی شتێکت پێ نیشان دەدات لەلایەن ئێمەوە کە چاوی تۆی پێ ڕوون ئەبێت دە بڕۆ ئەی رسول الله ﷺ لەسەر بەرەکەتی خوا ئێمە لەگەڵتین ئا لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ خۆشحاڵ بوو بزەیەک هات بەسەر لێوی فەرمووی:-
بە صحابەی خۆی با بەرێبکەوین ئا لەوکاتەدا بەڕێکەوتن بۆ شەڕی(بدر)

لە شەڕی (بدر)دا کە پێغەمبەرمان ﷺ گەڕانەوە غەنیمەتێکی یەکجار زۆریان بە دەست هێنا پێغەمبەر ﷺ زۆر ڕازی بوو لەو کاتەدا
لە دوایشدا لە (أنصارییەکان) بە تایبەت (سعدی کوڕی معاذ) وە خۆشەویستی

(سعدی کوڕی معاذ) تەواو کەوتبۆوە دڵی پێغەمبەرەوە ﷺ ماوەیەک بەسەر جیهادەکەیان تێپەڕ بوو تا گەیشت بە ساڵی پێنجی هجری واتە پێغەمبەر ﷺ (٥)ساڵ لە مەدینە بوو ،(٧)ساڵ بوو کە سعدی کوڕی معاذ ئیمانی هێنابوو ئەو کاتە سعد تەمەنی(٣٧)ساڵ بوو جولەکەکانی بەنی نضیر کە هەمیشە بوغزو قینی موسڵمانان لە دڵیان بوو ئەو کاتەش هەر ڕقیان هەبوو بە دینی رسول الله ﷺ لەبەر ئەوە جولەکەی بەنی نضیر هەستان لەگەڵ قورەیشیەکان قسەیان کرد،پێیان وتن وەڵاهی ئێمە زۆرمان پێ خۆشە لەوەی کە رسول الله ﷺ لەناو بچێ وە صحابیەکانی لە ناو بچن ئەم دینە بە تەواوی لە ناو بچێ ئێوە هەستن لە شکر ساز بکەن ئێمە بە تەواوی پشتان ئەگرین بەڵام وەڵاهی لە وەشدا هەر درۆزنن وەکو الله تعالى دەفەرمووێت (لە کاتی شەڕەکەشدا هەڵدێن و تواناى شەڕکردنیان نییە ) قورەیشییەکان زۆریان پێ خۆشە کە محمد و أصحابەکانی لەناوبچن بۆیە چوار هەزار لە شکر ئامادە ئەکەن لەو لاشەوە لەگەڵ تایەفەی (غطفان) قسە ئەکەن ئەم تایەفەیەش دوژمنایەتیەکی وایان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نیە بەڵام ئەوان بە دوای دونیاوەن ئەڵێن میوەی ساڵێکی خەیبەرمان پێ بدەن ئێمە لەگەڵتانین ئەوانیش ئەڵێن باشە

ئەوانیش (غطفانیەکان) شەش هەزار نەفەر دێن یانی (دە هەزار نەفەر لە قورەیشیەکان لە جولەکەکان و لە غطفانییەکان )ئامادە ئەبن بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر مەدینە وە بەسەر شاری رسول الله ﷺ لەولاوە خەبەر دەگات بە پێغەمبەر ﷺ کە لە شکری (أحزاب )ساز بوون پێغەمبەریش ﷺ صحابەکانی کۆکردەوەو گفتوگۆی لەگەڵ کردن کە چی بکەن پێغەمبەر ﷺ ئیشارەت ئەکات بەوەی کە لەناو مەدینەدا بمێننەوەو لێرە دیفاع لە خۆمان دەکەین لەو کاتەدا (سەلمانی فارسی)

ئەو پاڵەوانەی ئومەتی رسول الله ﷺ لەو کاتەدا (سەلمانی فارسی) ئیشارەت ئەدا بە پێغەمبەر ﷺ ئێمە لە وڵاتی خۆمان کە دوژمن هێرشی ئەهێنایە سەرمان خەندەقمان لێ ئەدا وە ژن و منالْمان لە جێگایەکی تر دادەنا پێغەمبەر ﷺ صحابەکانی ئەو ڕەئەی سەلمانی فارسیان وەرگرت ئافرەتەکان و منالْەکان دەبەن و دەیان خەنە نێو قەلاّی حارزەوە وە موسڵمانان خەریکی هەڵکەندنی خەندەق دەبن لەکاتی هەڵکەندنی خەندەقدا پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی کە وا لەگەڵیا بوون توشی برسیەتیەکی زۆر هاتن لەتاو برسێتی بەردیان لە سکیان هەڵگرتبوو

مهاجرەکان کاتێک دەیان بینی پێغەمبەرەکەیان ﷺ

بە دایک و باوکم بە فیدای بم وەکو خۆیان لە جەنگدا لە ئێش و ئازارو برسێتیدایە پێیان فەرموو

((نحن الذين بايعوا محمد على الجهاد مابقينا أبدا))

ئێمە ئەو کەسانەین کە بەیعەتمان داوە بە محمد ﷺ لەسەر جیهادکردن و شەڕکردن لە پێناو دینی محمد ﷺ هەتاوەکو کۆتای ..

بەڵێ بەم شێوازە صحابەکان پەروەردە بوون لەسەر ئیمان پەروەردە بوون

پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستەکەی خۆی (سعدی کوڕی معاذ )لەگەڵ( سعدی کوڕی عوبادە)

ئەیان نێرێت بچن لەگەڵ جولەکەکان قسە بکەن ئایا عهدو پەیمانەکەیان شکاندووە یان نا کە ئەچن دەڵێن ئەی ( بەنی قوریضة )

عهدو پەیمانتان لەگەڵ رسول الله ﷺ شکاندووە؟!

جولەکاکانیش دەڵێن، کوا عهدو پەیمان ئێمە هیچ عهدو پەیمانێکمان لەگەڵ ئێوە نەکردووە

سعديش ئەفەرموویت :- خۆتان دەبیننەوە بە ئیزنی الله هەڕەشەیان لیّ ئەکات ئەو بوغزو قینەیان لە دڵی هەڵئەگریّ و ئەگەڕیّتەوە لای پیّغەمبەر ﷺ لە بن گویّی دەڵیّت یا رسول الله ﷺ عهدو پەیمانیان شکاندووە
جولەکەکان کە (عەمری کوری عەبدو وەدیان )لەگەڵە کە کەسیّکە کافرەکان دەیان وت بە هەزار کەسە لە ئازایەتیدا کەدیّت لە خەندەقەکە خۆی دەپەڕیّنیّتەوەو دیّتە ناو موسڵمانان لەسەر ئەسپەکەی بە غرورو تەکەبوریەوە دەڵیّ کی هەیە بیّ شەڕم لەگەڵ بکات صحابەی پیّغەمبەر ﷺ بیّدەنگ دەبن

لەوکاتەدا پاڵەوانی جوامیّری ئومەتی محمد ﷺ ئاموزی رەسول الله پاڵەوانی قورەیش(علی کوڕی أبي طالب)ڕەزای خوای لیّبیّت دەڵیّت من شەڕت لەگەڵ دەکەم

دەفەرمویّ بانگت دەکەم بۆ دوو شت (دەڵیّ یان ئەوەتا وەرە شویّن قورئان بکەوە شویّن رسول الله بکەوە شویّن دینی إسلام بکەوە) هەرکەوا دەڵیّ (عەمر)دەڵیّ هیچ پیّویستیم بەوە نیە (علی کوڕی أبي طالب) رەزای خوای لیّبیّت دەفەرمویّت:
مادام پیّ ویستت بەوە نیە کەوایە ئامادەم شەڕت لەگەڵ بکەم جا (عەمر) کە دەبینیّت و سەیر دەکات بە لوت بەرزیەوە ( إیمامی علی)گەنجیّکی تازە پیّگەیشتوە دەڵیّ تۆ منداڵیّکی پیّم خۆش نیە تۆ بکوژم تۆ برۆ (إیمامی علی ) وەکو شیّر بەجواب دیّت و دەفەرمویّت وەللەهی من زۆرم پیّخۆشە کە تۆ بکوژم کە ئەوە لە (إیمامی علی) دەبیستیّ لەسەر ئەسپەکەی دیّتە خوارەوە کە شمشیّرەکەی دەردیّنیّ بچیّ ڕوبەڕوی (إیمامی علی )بیّتەوە
فریاناکەویّ دەست بکاتەوە یەکسەر لاشەی بۆگەنی دەکەویّتە سەر عەرز

پێشتر «غەطفانیەکان » قسیەیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردبوو پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووبون: من یەک سوەمی میوەی مەدینەتان پێدەدەم «شەش هەزار لەشکرەکەتان بکشێنە دواوە»

(سعدی کوڕی معاذ) لەگەڵ (سعدی کوڕی عوبادە )کە گوێیان لەو قسەیە دەبێت فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چیت کردوە لەگەڵ «غەطفانیەکان» فەرمووی(یەک سوەمی میوەی مەدینەم پێداون بۆ ئەوەی شەڕمان لەگەڵ نەکەن)

(سعدی کوڕی معاذ)فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕەئیەی کە هەڵت بژاردوە بڕیاری خۆتە یا وەحی خوایە هیچ قسەی تێدانیە!!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بڕیاری خۆمە (سعدی کوڕی معاذ) فەرمووی ئەی رسول الله ﷺ
ئەوکاتەی ئێمە بێ دین بوین لەسەر شرک بووین نە ئیمەو نە (غەطفانیەکان) عیبادەتی خوامان نەدەکرد
ئەوکاتە (غەطفانیەکان) نەیان دەتوانی میوەی مەدینە لەگەڵ ئێمە بەش بکەن ئێستا لەحاڵێکدا کە خوای تعالی بە تۆو إسلام عیزەتی پێداوین میوەی مەدینەیان پێبدەین !!! واللەهی یا رسول الله ﷺ جگە لە شمشێر هیچی تریان پێ نادەین هەتا خوای تعالی لە بەینی ئێمەو ئەواندا حوکم دەکات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی منیش لەسەر ڕەئی ئێوەم لەولاشەوە یەکسەر (ئەحزابیەکان)بەینیان لەگەڵ (بنی نضیرەکان )دەشێوێت مەیدانی جەنگ جێ دەهێڵن پێغەمبەر ﷺ و صحابەکان یەکجار دڵخۆش دەبن بە تکبیر و( الله أکبر و لا الە الا الله )دەگەڕێنەوە ناو شاری مەدینە کە خوای گەورە سەرکەوتنی بە نسیبکردن

پێغەمبەر ﷺ خەریک بو جلی شەڕی دابنێ (جبرئیل  علیه سلام) لەسەر شکڵی یەکێک لە ئەصحابەکان دێتە لای لەسەر ئەسپەکەی (جبرئیل) پێی ئەفەرموێ:  ئەی محمد ﷺ جلەکانی شەڕت دادەنێیت لەکاتێکدا مەلائیکەتەکانی خوای تعالی هێشتا جلەکانیان دانەناوە !!!

ئەوە من بەڕێ دەکەوم بەرەو (بەنی قورەیضە) ئێوەش بەڕێ بکەون

پێغەمبەری خوا ﷺ هاواری لە صحابەکەن کرد فەرمووی ئەی صحابەکان نوێژی عصر ناکەین ئیلا لە (بەنی قورەیضە)نەبێتهەموو بەڕێ دەکەون لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەر ﷺ بەشوێنێک دا تێدەپەڕێت دەستەیەک دانیشتون دەفەرمووێت ئەسپ سوارێکتان نەدیوە بێرەدا بڕوات گوتیان بەڵێ

وللە ئەسپ سوارەکەش (جبرئیل) بوو علیه سلام

(بەنی قورەیضە) داوایان کرد لە پێغەمبەری خودا ﷺ مۆڵەتمان پێبدە ئێمە قسەت لەگەڵ دەکەین صولح دەکەین پێغەمبەریش ﷺ لە مەوقفەکەیان زۆر نارەحەت بوو

لەولاشەوە (سعدی کوڕی معاذ) بوغزو  کینەیەکی زۆری لە دڵ دابو بەرامبەریان (سعد کوڕی معاذ) لە شەڕی خەندەقدا

کە بە لای دایکی ڕۆیشت درعێکی لەبەر دابوو کە قۆڵەکانی ڕووت بوون تەواوی لاشەی دانەپۆشیبوو

دایکە عائشە (رضی الله عنها) کاتێک چاوی کەوتە قۆڵی (سعد کوڕی معاذ) ئەو کات هێشتا ئایەتی حیجاب دانەبەزیبوو، بە دایکی سعدی وت:

واللەهی درعەکەی زۆر کورتە دەترسم شتێکی بەسەر بێت

دایکیشی ڕووی کردە سعد پێی وت:

ئەی سعد ئەوە بۆ لەگەڵ ڕەفیقەکانت دواکەوتووی!!

پێی نەوت سعد بڕۆ درعێکی گەورە لەبەرکە قۆڵت داپۆشە
وتی: بۆچی لە ڕەفیقەکانت دابڕاوی..!
بڕۆ سعد بڕۆ پێشەوە بڕۆ نێو مەیدانی شەڕ، کە سعد ڕۆیشت دیفاعیان دەکرد لە موسوڵمانان
پیاوێک بە ناوی (ابو عرەقە) تیرێکی هاوێشت ودای لە ڕەگی قۆڵی [سعدی کوری معاذ]کە دای لە ڕەگەکە وتی:
ئەو تیرەم لێ بگرە، منیش ابوعرەقەم
[سعدی کوڕی معاذ] فەرموی: خوای تعالی دەم و چاوت بسوتێنی لە ئاگر، لەسەر ئەو تیرە بەردەوام خوێن لە قۆڵی (سعدی کوڕی معاذ) دەهات
(سعد) کە تیرەکەی پێ کەوت فەرمووی:خوایە ئەگەر لە شەڕی قوڕەیش شتێکت هێشتۆتەوە خوایە من بهێڵەوە بۆ ئەو شەڕە چونکە شەڕکردن لە لای من لەگەڵ هیچ قەومێ خۆشتر نیە لەگەڵ قەومێک کە پێغەمبەرەکەی تۆیـان دەرکردبوو چونکە ئەوان پێغەمبەرەکەی تۆیان دوور خستەوە

وە خوایە گەر شەڕیشت لەگەڵ قوڕەیش تەواوکردووە یارب خوایە ئەو تیرەم بۆ بکەی بە شەهادەت
یا رب خوایە شەهیدم بکەی بم بەیتەوە بۆ لای خۆت هەرچی زووترە
بەڵام خوایە نەممرێنی و شەهیدم نەکەی هەتا چاوم ڕوون دەکەی بە(بەنی قورەیضە) چونکە بوغز و قینەیەکی زۆری لە دڵدا بوو دواتر، هێنایانەوە بۆ مزگەوت پێغەمبەر ﷺ کە دەیبینێ خۆشەویستەکەی تیری بەرکەوتووە یەکسەر خۆی هات لەگەڵ صەحابەکان لە مزگەوت چادرێکیان بۆ هەڵدا

ئافرەتێک بە ناوی (رفەیدە) پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:
ئاگاداری بە، برینەکانی بۆ تیمار بکە
کە برینەکانی تیمار دەکات پێغەمبەر ﷺ ئێواران وبەیانیان دەهات بۆ لای پێی ئەفەرموو: بەیانیت چۆن کردەوە؟ ئێوارەت چۆن کردەوە؟
(سعدی کوڕی معاذ)یش قسەی دەکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ بە سعدی فەرموو:
یا رب چۆن ئەو وەعدەی داوتە بە خوای پەروەردگار، یا رب خوای تعالی ش وەعدی خۆیت لەسەر جێ بەجێ بکات و فردەوس الاعلی بە نسیبت بکات

(سعد) زۆر دڵی خۆشبوو بەو دوعایەی پێغەمبەر ﷺ کە شەڕەکـە تەواو بـوو برینەکەی (سعدی کوڕی معاذ) چاک بوو، بەڵام تاقەتی دونیایی نەمابوو تامەزرۆیی لیقای الله بوو ئاواتە خوازبوو هەرچی زووترە بگەڕێتەوە لای الله جل جلالە پێی خۆشبوو هەرچی زووترە وەک ڕەفیقەکانــی تری وەک(مصعب و حمزە)

کە مەلائیکەتی خوای تعالی شۆریان زۆری پێ خۆشبوو وەک ئەوان هەرچی زووترە بچێ بۆ دیداری الله تعالی

فەرمووی: خوایە داوای شەهیدیت لێ ئەکەم خوایە ئەو برینەی کە توشی بووم دووبارە خوێنی لێ بێتەوە خوایە شەهیدم بکەیت
سبحان الله...
ئەو صەحابەیەی ئەم حەدیثە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێ:
واللهی کە هەر ئەو دوعایەی کرد یەکسەر برینەکەی کرایەوە خوێن بە برینەکەی هاتە خوارەوە "الله اکبر"

تایفەی ئەوس دەڵێن  ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (قورەیضیەکان) لەگەڵ ئێمە عهد و پەیمانیان بەستبوو داوایان لێ کرد لەگەڵ (بەنی قوڕەیضە)   نەرم ونیان بێت

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆن سعد بێنن، (سعدی کوڕی معاذ) یان هەڵگرت لە مزگەوت خوێن لە دەستی موبارەکی دەهات

 کە هێنایان پێغەمبەر ﷺ وەک ڕێز گرتنێک لە سعد فەرمووی:(قوموا الی سیدکم) هەستن بە ڕووی سەیدەکەتان داییگرن لەسەر ئەسپەکە

گەورەکانی (ئەوس) دەهاتن بۆ لای (سعد کوری معاذ) دەیان وت:(سعد) ئاگاداربە!

(بەنی قوڕەیضە) عهد و پەیمانیان لەگەڵ ئێمە بوو (سعد) فەرمووی:
ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە سعد لە پێناوی خوای تعالی دا لۆمەی هیچ لۆمە کارێک کاری تێنەکات
بەنی (قورەیضیەکان) کۆبوونەوە گەورەی (قورەیضیەکان) زوو زوو سەردانی (سەعدی) ئەکرد خۆی فەقیر و زەلیل دەرئەخست وەکو مونافیقەکان

 (سەعدی کوڕی معاذ)فەرمووی:
ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ
پیاوەکانیان لە گەردەنیان ئەدەین وە ژن و منداڵەکانیشیان بە ئەسیر ئەگرین

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:
واللەهی سەعد حوکمت کرد بە حوکمی الله لەسەر حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە
فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوەکانیان هەر (هەشت سەدیان) لە گەردەنیان
ئەدەین و ژن و منداڵەکانیشیان با ببن بە بەندە لای موسڵمانان لە گەردەنی هەر
هەشت سەد پیاوەکەیان دا لە هەندێک ڕیوایەتیش هاتووە کەچوار سەد بن

(سەعد) لەو کاتەیا بوغز و کین لە دڵیا نیشتەوە ئەو کاتە زۆر خۆشحاڵ بوو کە لە
پێناوی خوای تعالی حوکمێکی کرد کە حوکمی خوای تعالی بوو
دواتر سەعدی کوڕی معاز حاڵی تێکچوو یەکسەر بردیانەوە مزگەوت کاتێک
پێغەمبەر ﷺ سەری لە (سەعدی کوڕی معاذ)ئەدا لە مزگەوت
لەسەرە مەرگا بوو (سەعد)چاوەکانی لەسەر یەک نابوو وە دوای ئەوەی داوای لە
خوای تعالی کرد شەهادەتی بە نسیب بکا هەر لە دوای دوعاکە یەکسەر خوای
تعالی سەعدی بردەوە لای خۆی

کاتێک( سەعد )وەفاتی کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ببیەنەوە بۆ لای تائیفەکەی خۆی
با غوسلی بکەن و بیشۆن صەحابە ئەفەرموێ بە دوای پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوتین بۆ
لای ماڵی (سەعدی کوڕی معاذ)
ئەڵێ پێغەمبەر ﷺ زۆر بە پەلە پەل ئەڕۆشت واللەهی تاقەت و توانای ڕۆشتنمان
نەبوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە سەڕیعی ئەڕۆشت صەحابە هەنێکیان شکاتیان
کرد وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ واللەهی لەوە زیاتر توانامان نییە وا خێرا
ئەڕۆی

فەرمووی پێغەمبەر ﷺ ئەترسم مەلائیکەی خوای تعالی پێش ئێمە سەعد بشۆن با زوو بڕۆین کە دایکی سەعدی بینی وەفاتی کردووە دەستی کردە گریان
پێغەمبەر ﷺ فەرموی:
هەر ئافرەتێک بەسەر مردوەکەیدا ئەمرێت درۆ ئەکات مەگەردایکی سعد نەبێت

کە(سعدی کوڕی معاذ)یان هەڵگرت و هێنایان بەرەو گۆڕستان صەحابە وتیان :
ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەیتەکەی سعد زۆر سوکە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: چ شتێک ڕێگری ئەکات لەوەی مەیتەکەی سعد سوک بێت لە حاڵێکدا کە ئەوەندەو ئەوەندە مەلائیکەی خوای گەورە دابەزیونەتە خوارەوە کە پێشتر قەت نەهاتونەتە خوارەوە بۆ هەڵگرتنی جەنازەی (سعدی کوڕی معاذ)
الله اکبر لەو ڕێزە،لەو ڕێزەی خوای تعالی دای بە سعد

پێغەمبەر ﷺ زۆر نارەحەت ئەبێت بە وەفاتی سعد
ئەوکاتەی کە هێشتا جەنازەکەیان نەبردۆتە دەرەوە

دایکە عائیشە رضی الله عنها دەفەرموێت : ئێمە لە دیوێکی بووین گوێمان لێبوو (ابو بکر و عمرو صەحابەکان) ئەگریان بەسەر جەنازەی (سعدی کوڕی معاذ)

دایکە عائیشە رضی الله عنها دەفەرموێت: واللەهی دەنگی (ابوبکرو عمر)م لێک دەکردەوە کێیان (ابوبکر)ە کێیان (عمرە)کە ئەگرین بەسەر (سعدی کوڕی معاذ)ەوە ئەوەندە بە دەنگەوە ئەگریان

پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا بۆ هیچ کەسێک ئەوەندە نەگریابوو کە بۆ سعد گریا

(جبرائیل علیه سلام) هاتە خوارەوە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ
بە پێغەمبەری فەرموو:
ئەو عەبدە صاڵحەی وەفاتی کردوە کێیە ئەی موحەممەد؟؟
ئا ئێستا دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرایەوە وە عەرشی خوای تعالی هاتە لەرزین بۆی سبحان الله عەرش لەخۆشی ئەوەی کە سعد ئەچێتە لای کەوتە لەرزین ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: عەرشی خوای تعالی بۆ مردنی (سعدی کوڕی معاذ) لەرزی

لە پێشودا کە حەریرێکیان بە پێغەمبەر ﷺ نیشان دابوو فەرموی:
واللەهی عەمامەکەی (سعدی کوڕی معاذ) لە بەهەشتدا لەو حەریرە جوانترە..

لە گەورەیی (سعدی کوڕی معاذ) کاتێک کە وەفاتی کرد (حەفتا هەزار) مەلائیکە بۆ هەڵگرتنی جەنازەی (سعدی کوڕی معاذ) هاتبون بۆ ئەوەی بە سعد بڵێن:
مەترسە ئەی سعد ، نیگەران مەبە ئەی سعد ، موژدەت لێبێت ئەی سعد ، بەو بەهەشتەی خوای تعالی کە وەعدی پێدابووی...
کە (سعدی کوری معاذ) یان بەرەو قەبرسان بەرێکرد دایکی سعد هەر ئەگریا فرمێسک لەچاوەکانی ڕانەدەوەستا بێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە دایکی سعد و پێی فەرموو: ئەی دایکی سعد فرمێسکەکانت وشک نابن وە نیگەرانی و نارەحەتیت کەم نابێتەوە لەحاڵێکدا کە کورەکەی تۆ یەکەمین کەسە کە خوای تعالی بە دەمیەوە پێبکەنێت وە عەرشی الله بۆی بلەرزێت

چۆن فرمێسکەکانت وشک نابن ئەی دایکی سعد

ئا بەم شێوەیە سعد پلەی شەهیدی بە دەست هێنا گەڕایەوە بۆ لای خالقەکەی بە لیقای الله شادبوویەوە وە گەیشتەوە بە هاورێکانی کە شەهید بوون بێشتر سعد ئەوەی بیستبوو لە بێغەمبەر ﷺ کە پلەی شەهیدبوون چی خۆشیەکە بۆیە وا تامەزرۆ بوو

یلە بێغەمبەریەوە بیستبوو ﷺ کە ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە کە شەوێکیان مەلائیکەی خوای تعالى لە دارێکەوە بردیانە سەرەوە کە چووە سەرەوە ماڵێکی یەکجار خۆشم دیت قەد ماڵی ئاوا خۆشم نەدیبوو پرسیارم کرد لە مەلائیکەی خوات تعالى ئەو ماڵانە ماڵی کێن ئەوەنە جوانن!!
وتیان ئەم ماڵانە ماڵی شەهیدانی ئومەتی تۆن ئەی رسول الله ﷺ

پێشتر بیستبویان لە رسول الله ﷺ لەبەر دەرگای بەهەشت هێشتا حیساب کردن تەواو نەبوە دەستەیەک دەچن لەبەر دەرگای بەهەشت دەوەستن دەرگاوانی بەهەشت دەڵێن ئێوە کێن؟؟
خۆ هێشتا حیساب و کیتاب دەسی بێنەکردووە!!

ئەوانیش دەڵێن تەپو تۆزی مەیدانی جیهاد وبریقەی شمشێری جیهاد حیسابی لەسەر ئێمە نەهێشتووە ئێمەش بێ حیساب هاتووین

ئەمانەی بیستبوو (سعد) بۆیە تامەزۆری شەهیدبوون بوو
ئێمەش دەبێ مناڵەکانمان وا پەروەردە بکەین کە هەر لە منالْیەوە خۆشەویستی
شەهادەت لە دلْیاندا هەبێ هەر ئومەتێک خۆشەویستی شەهادەت لە دلْیا هەبێ ئیلا
مەگەر خوای گەورە سەرکەوتی ئەکا لە دنیاو قیامەت
بینیتانخۆ سعد گەنج بوو وە جوان بوو وە سەرکردە بوو کەچی خۆی بەخت کرد بۆ
خوا
بۆ پێغەمبەر صل الله علیه وسلم بۆ ئیسلام بوو بە داعی بوو بە خزمەتکاری ئیسلام
وازی لە لەزەتەکانی دونیا هێنا چونکە زانی کۆتایی پێ دێ خۆی بەری کرد
لەکافران چونکە زانی کافر پوچە گەر بەدەسەڵاتیش بێ

**لە کۆتایدا ڕومان دەکەینە لاوانی خوێنگەرمی موسڵمان**

دەی ئێوەش هەڵمەت بکەنشکۆی ئیسلام بەرزبکەنەوەسوننەتەکان زیندوو بکەنەوە
مەیەڵن گاڵتە بە دینەکەتان بکرێ
سعد ئاسا بوغزتان هەبێ بەرامبەر کافران
بخوێنن و مناڵەکانتان پەروەردە بکەن وەك سعد
بخوێنن و سەربەرزی بەدەس بێنن
بخوێنن با شکۆدار بنبخوێنن تا سعد ئاسا بن
بخوێنن با الله لێتان رازی بێ
بخوێنن تا گۆرتان فراوان بێ
بخوێنن تا بەهەشت بەدەست بێنن...

